# بسم الله الرحمن الرحيم




# چۆنیەتی فۆرمات کردنی کۆمپیوتەر بە فلاش میمۆری

Hangaw_HawlerY
Hangaw_HawlerY@Yahoo.com
Hangaw_HawlerY@Hotmail.com
www.h4kurd.com
www.kurd-security.com

**زۆر جاران گوی بیستی ئەوە دەبین کە دەتوانین بە بێ سیدی کۆمپیوتەرەکەمان فۆرمات بکەین یان کۆمپیوتەر هەیە** Mini **یە جیگای سیدی نیە بۆیە ئەگەر بمانەویت فۆرماتی بکەین ئەوە دەبیت** CD Drive External **بە کار بهینین بۆ فۆرمات کردنی بۆیە بە باشم زانی وانەیەکی نوێ دروست بکەم کە باس لە چۆنیەتی دانانی** Windows **بکات بۆ سەر** USB Flash Memory **، ئێمە دەتوانین سیستەمی** Windows**بە هەردوو جۆرەکانی** (XP , 7) **و سیستەمی** Linux **بە هەموو دابەشکراوەکانی وەك** (RedHat , Fedora ,Mandriva .....) **دابەزێنینە سەر** Flash Memory **کە بە شیوەی** Boot **ئیش بکات ، ئەوەی کە ئیستا باسی دەکەم لەم وانەیە دابەزاندنی**Windows 7 **ە لەسەر فلاش ، بەڕێزان کاتیك کۆمپیوتەریك بە فلاش فۆرمات دەکەی ئەوە خیرایەکی زۆر زیاترە لە دابەزاندنی وەك ئەوەی کە بە سیدی فۆرمات دەکەی وە من وەك و خۆم تاقیکردنەوەم زۆرم لەسەری هەیە هیچ کیشەی نیە و بە** 15 **دەقیقە** windows**م دابەزاندیە ، وە پیوستە ئەو فلاشەی کە بە کاری دەهینیت بۆ** windows xp **لە** 1 GB **کە متر نەبیت و بۆ** windows 7 **لەسەرەوەی** 2 GB **بیت .**

سەرەتا پیوستە لە مالپەری سەرەکی پرۆگرامەکە دابەزینین www.wintoflash.com وە بۆ دابەزاندنی فایلەکەش برۆ ئەم شوینی لە ناو سایتەکە www.wintoflash.com/download/en

پاش دابەزاندن وەك ئەم وێنەیە .




ئیستا پێویستە ئەو فایلە لە Zip دەربهینین بۆ ئەوەی هەموو فایلەکان ببین و بتوانین ئیشی پی بکەین ، بۆ Extract کلیکی راست لەسەر فایلەکە بکە ، وەك ئەم وێنەیە.




پاش ئەوە فۆلدەریك دروست دەبیت بە ناوی Novicorp WinToFlash 0.7.0010 beta وەك ئەم وینەیە.



ئینجا فۆڵدەرەكە دەكەینەوە چەند فایل و فۆڵدەریكی لە ناوە وەك ئەم وێنەیە .




پاش ئەوە كلیك لەسەر WinToFlash دەكەین و كەمێك چاوەری دەكەینەوە تا بكریتەوە .




پاش بوونەوەی پیوستە چەند هەنگاوێك جێ بە جێ بكەین بۆ Activeكردنی پرۆگرامەكە ، كاتیك پرۆگرامەكە بەو شێوەیە كرایەوە ئەوە كلیك لەسەر Next دەكەین .



ئینجا وەك و ئەو وێنانەی خوارەوە هەنگاوەکانی دواتر جێ بە جێ بکە .




ئەم جارەیان پێش ئەوەی کلیك لەسەر Next بکەین پێوستە کلیك لەسەر Active بکەین



پاشان كليك لەسەر Selectدەكەين بۆ هينانى شوينى فايلى activeكردنەكە .




ئينجا دەچينە ناو فۆلدەرى License كە هەر لەناو فۆلدەرەكەى خۆيدا هەيە كە پيشتر Extractمان كردبوو



له ناو ئەو فۆلدەرە فایلیکی تیدایە بە ناوی WinToFlash 863167.nkey

ئینجا کلیکی لەسەر دەکەین ، وەك ئەم وێنەیە .




پاش ئەوە فایلەکە وەردەگریت و بەم شێوەی لیٚ دیٚت و بەردەوام دەبین ......



دواتر ...


First start wizard
Commercial
Intresting software from partners:
Error while getting ad
< Back
Exit

دواتر ......


First start wizard
Finished
Thank you for using Novicorp WinToFlash!
Press Next to exit the First Start Wizard
< Back
Exit

ئیستا تەواو بووین لە active کردنی پرۆگرامەکە ، ئەوەی ماوە تەنیا کار پیکردنەکەیەتی ، پاش ئەوە کلیك لەسەر Windows Setup transfer Wizard دەکەین .




دواتر.....



ئیستا ئەوەی لێرە پیوستە بیزانین شوینی فایلی Windows و Flash Memory یەکەیە ، ئەووەی یەکەم کە نوسراوە Windows files path ئەوە دەبیتە شوینی فایلەکانی Windows ەکە ، وە ئەووەی نوسراوە USB drive ئەووەش دەبیتە شوینی فلاش میمۆریەکە




دواتر كليك لەسەر Next دەكەين .



پاش ئەوە پەنجەرەیەکی ترت بۆ دێت کە پێت دەڵێت هەموو فایلەکانی ناو فلاشەکەت دەسڕیتەوە ، فلاشەکەت فۆرمات دەبێت ، پێوستە لەم کاتەدا هیچ فایلێکی پێوستی خۆت لە ناو فلاشەکەت نەبێت چوونکە هەرچی تێدا بێت دەی سڕیتەوە .




پاش ئەوەی کە کلیك لەسەر OK داگرت ئینجا دەست دەکات بە کۆپی کردنی فایلەکان بۆ ناو فلاشەکەت .



چاوەری دەکەین تاوەکو تەواو دەبیت ................




پاش تەواو بوون ئینجا کلیك لەسەر Next دەکەین و پاش ئەوە کلیك لەسەر Exitدەکەین.



**ئەگەر سەیرێکی ناو فلاشەکە بکەین دەبینین هەموو فایلەکانی Windows تێدایە.**




**ئیستا فلاشەکەت ئامادیە بۆ فۆرمات کردنی کۆمپیوتەر ، کاتیك کۆمپیوتەرەکەت ریستارت دەکەیتەوە دەتەویت فۆرماتی بکەیت ئەوە پیوستە لە جیاتی هەلبژاردنی سیدی پیوستە فلاش هەلبژیریت .**

**زۆربەی ئەو کۆمپیوتەرانەی کە دەچیتە ناو Boot بەۆهی F12 یە ئەگەر نا پیوستە لە Bios چالاکی بکەیت ، وابزانم ئەووی ماوە پیوست بە فیرکاری ناکات چوونکە ئەگەر بزانیت کۆمپیوتەر فۆرمات بکەیت ئەوە دەزانی چۆن Boot چالاك دەکریت لە Bios.**

2011-6-24

**هەینی**

5:57 PM